بەغەیری شەرعی خوا تیایدا حوکمی نەکردوە ، بۆیە ئەگەر وازهێنانەکەی بەهۆی ئینکاری و نکۆڵی کردن بێ ئەوە کوفری گەورەیە و کافر بوە ، بەلام ئەگەر وازهێنانەکەی بەهۆی هەواو ئارەزوو یان تەماعێکی دونیایی بوبێ باوەڕی وابێ حوکم کردن بەحوکمی الله واجبە لەسەری ئەوە حاڵەتەکەی کوفری بچوکە وەك یەکێکە لە تاوان و سرپێچیەکان و بۆکافربونی پێویست بە حەڵاڵ زانینی دەکات لەلایەن خاوەنەکەیەوە .

11- شیخی ئیسلام (ابن تیمیة) لە مجموع الفتاوی " (3/267) ئەفەرمیت:

والإنسان متى حلّل الحرام المجمع عليه أو حرم الحرام المجمع عليهأو بدل الشرع المجمع عليه كان كافراً مرتداً باتفاق الفقهاء، وفي مثل هذا نزل قوله على أحد القولين : ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللّهُ فَأُوْلَـئِكَهُمُ الْكَافِرُونَ﴾ [المائدة:44] ؛أي: المستحل للحكم بغير ما أنزل الله.

واتە: ئینسان هەرکاتێك حەڵاڵێکی حەرام کرد یان حەرامێکی حەڵاڵکرد کە کۆدەنگی لەسەرە ، یان شەرعی گۆڕی کە کۆدەنگی لەسەرە ، ئەوە بەڕەزامەندی شەرعناسان کافر و مورتەدە، هەر لەم بارەشەوە لەسەر یەکێك لە وتەکان ئەم ئایەتەی خوای گەورە دابەزیوە ( ومن لم یحکم بما انزل الله فأولئك هم الكافرون ) یەعنی، بەحەڵاڵی بزانێ حوکم نەکردن بەو حوکمەی الله دایبەزاندوە.

منیش ئەڵێم: پێشەوا (ابن تيمية) باس لە حوكمی ئەو كەسە دەكات كە حەڵاڵێك حەرام دەكات یان حەرامێك حەڵاڵ دەكات وە باس لە حوكمی ئەو كەسە دەكات كە حوكمی شەرع دەگۆڕێ وەك حاڵی جولەكەكان كە ئایەتەكانی 44 و 45 و 46 ی سورەتی مائیدەیان لەبارەوە دابەزی و حوكمی خوایان گۆڕیبوو لەبەردباران كردنی زیناكار بۆ دەموچاو رەش كردنی و گەراندنی بەناو خەڵكیدا بەو كارەش حوكمی خوایان گۆڕی، شیخی ئیسلام (ابن تيمية) ئەم كارە بە كوفری گەورە و هەڵگەڕانەوە لە دین ناودەبات بەرەزامەندی شەرعناسان.

12- هەروەها پێشەوا (ابن تيمية) لە منهاج السنة ( 5/130) ئەفەرمیت:

قال تعالى: ﴿فَلاَ وَرَبِّكَ لاَ يُؤْمِنُونَ حَتَّىَ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لاَ يَجِدُواْ فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُواْ تَسْلِيمًا﴾ [النساء:65]؛ فمن لم يلتزم تحكيم الله ورسوله فيما شجر بينهم ؛ فقد أقسم الله بنفسه أنه لا يؤمن ، وأما من كان ملتزماً لحكم الله ورسوله باطناً وظاهراً ، لكن عصى واتبع هواه؛ فهذا بمنزلة أمثاله من العصاة.وهذه الآية ممايحتج بها الخوارج على تكفير ولاة الأمر الذين لا يحكمون بما أنزلالله ، ثم يزعمون أن اعتقادهم هو حكم الله . وقد تكلم الناس بما يطول ذكره هنا، وما ذكرته يدل عليه سياق الآية".

واتە: الله تعالى ئەفەرمويت( فلا وربك لايؤمنون حتى يحكموك فيما شجر

بينهم ثم لايجدوا فى أنفسهم حرجا مما قضيت ويسلموا تسليما )هەرکەسێك دەستگرتوو نەبێت بەداوەری کردنی خوا و پێغەمبەرەکەی لەکێشە و ناکۆکیەکانی نێوانیان، ئەوا الله تعالی سوێندی بەنەفسی خۆی خواردوە کە ئیمان ناهێنن، بەلام کەسێك لە ئاشکرا و پەنهانیدا دەستگرتوو بێت بە حوکم خوا و پێغەمبەرەکەی، بەلام سەرپێچی بکات و شوێنی هەواو ئارەزوی بکەوێ ئەمە لە مەنزیلەتی هاوشێوەکانێتی لە سەرپێچی کاران، ئەم ئایەتە لەو ئایەتانەیە کە خەوارج بەڵگەی پێ دێننەوە لە کافر کردنی ئەو کاربەدەستانەی حوکم ناکەن بەوەی الله دایبەزاندوە، پاشان وا گومان دەبەن کە تەنها باوەریان بە حوکمی خوایە، خەڵکیش ئەم باسەیان کردوە ئەوەی باسمکردوە بەڵگەیە لەسەری روکاری ئایەتەکە.

منیش ئەڵیم : شیخ الاسلام (ابن تیمیة) باس لەوازهێنانی داوەری کردن (التحاکم)دەکات بۆلای پێغەمبەر صل الله علیه وسلم نەك داوەری کردن بۆلای عەیری شەریعەتی الله، چونکە داوەری بردن بۆلای غەیری شەریعەتی الله، داوەری بردنە بۆ لای طاغوت و ئیمانە هێنانە پێی و کوفرکردنە بە خوای مەزن، بەبێ ئەوەی رەچاوی بیروباوەری کەسەکە بکرێ ، بەدەقی ئەم ئایەتە پیرۆزەی الله تعالی ،

أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ آَمَنُوا بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنْزِلَ مِنْ قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَنْ يَتَحَاكَمُوا إِلَى الطَّاغُوتِ وَقَدْ أُمِرُوا أَنْ يَكْفُرُوا بِهِ وَيُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَنْ يُضِلَّهُمْ ضَلَالًا بَعِيدًا "(النساء :60) بەڵام ئەگەر کەسێك لە ئاشکرا و

پەنهانیدا دەستگرتوو بێت بە داوەری کردن بۆ لای حوکمی خواو پێغەمبەرەکەی ، بەڵام لە ڕووداوێکدا واز لەداوەری کردن بینێت بۆ لای پێغەمبەر صل الله علیه وسلم بەهۆی هەواو ئارەزوو یان حوکم نەکات بەشەرعی خوا لە رووداوێکدا بەهۆی هەواو ئارەزوو نەك بەهۆی نکۆڵی لەو حوکمە یان گۆرینی یان داوەری بردن بۆلای غەیری شەریعەتی خوا بەوەش دەچێتە ریزی سەرپێچیکاران بەبەڵگەی ئەوەی ئەفەرمیت:(ئەم ئایەتە لەوانەیە کە خەوارج بەڵگەی پێ دێینەوە بۆ تەکفیرکردنی ئەو کاربەدەستانەی حوکم ناکەن بەوحوکمەی الله دایبەزاندوە)بۆیە ئەو کاربەدەستانەی ئەو سەردەمە کە خوارج تەکفیریان دەکردن بەبەڵگەی ئەم ئایەتە هەموو ئەودەسەلاتدارانە بەشەرعی خوا حوکمیان دەکرد بەلام لەهەندێك ڕووداودا حوکمیان بەگوێرەی حوکمی خوا ناکرد بەهۆی سەرپێچی و هەواو ئارەزوو نەك بەهۆی نکۆڵی کردن و حوکم کردن بەغەیری شەریعەتی الله(هەروەك حاڵی دەسەلاتدارەکانی ئەمرۆ)تەنانەت لەیەك مەسەلەشدا هیچ دەسەڵاتدارێك نەبوە لەسەردەمی خەوارج حوکمیان بەغەیری شەرعی خوا کردبێت، چونکە ئەگەر شتی وا روی بدایە ئەوە سادەترین موەحید تەکفیری دەکرد و هیچ کەسێك دوودڵ نەدەبوو لە دەرچونی لە میلەتی ئیسلام.

13- وە پێشەوا (ابن تیمیة) لە "مجموع الفتاوی"(7/312) ئەفەرمێت:

"وإذا كان من قول السلف: (إن الإنسان يكون فيه إيمان ونفاق)، فكذلك في قولهم: (إنه يكون فيه إيمان وكفر) ليس هو الكفر الذي ينقل عن الملّة، كما قال ابن عباس وأصحابه في قوله تعالى: ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللّهُ فَأُوْلَـئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾ قالوا: كفروا كفراً لا ينقل عن الملة، وقد اتّبعهم على ذلك أحمد بن حنبل وغيره من أئمة السنة".

واته : ئەگەر لەوتەی پێشین بێت: ( ئەكرێ ئینسان ئیمان و دووڕوویی تێدا بێت) هەروەها لە ئەفەرمون ( ئەشێ كوفر و ئیمانی تێدا بێت) جگە لە كوفری دەرهێنەر لە ئیسلام، هەروەك عەبدوڵای كوری عەباس و هاوەڵەكانی فەرموویانە دەربارەی ئەم ئایەتەی الله تعالى : ( ومن لم يحكم بما أنزل الله فأولئك هم الكافرون ) ئەمە كوفرێكە دەرهێنەر نیە لەئیسلام لەمەشدا ئەحمەدی كوری حەنبەل و عەیری ئەویش لە پێشەوایانی ئەهلی سونە شوێنیان كەوتون.

منیش ئەڵێم : شیخی ئیسلام (ابن تيمية) لێرەدا باس لە حوكم نەكردن دەكات بەو حوكمەی الله دایبەزاندوە نەك حوكم كردن بەغەیری شەرعی الله، گەورەترین بەڵگەش بۆ ئەوە شایەدی دانێتی بەوتەی ابن عباس و هاوەڵەكانی كاتێ وەڵامی خەواریجەكانیان دایەوە، ئەمەش وتەی (ابن تيمية) دەربارەی ئەو حاكمەی بەغەیری شەریعەتی الله حوكم دەكات : هەركاتێك ئینسان حەرامێكی حەڵاڵ كرد كە كۆدەنگی لەسەرە یان حەڵاڵێكی حەرام كرد كە كۆدەنگی لەسەرە یان شەرعی گۆری كە كۆدەنگی لەسەرە ئەوا بە رەزامەندی شەرعناسان كافر دەبیت.

(مجموع الفتاوى : 3 / 267.)

وه ئەفەرمێت :

: " ومعلوم أن من أسقط الأمر والنهي الذي بعث الله به رسله فهو كافر باتفاق المسلمين واليهود والنصارى " (مجموع الفتاوى : 8/ 106)

واته : زانراوه هەركەسێك ئەو فەرمان و قەدەغەكراوانەى الله تعالى بەپێغەمبەرەكانى ناردوە لەكارى بخات ئەوا كافره بە ڕەزامەندى هەموو موسڵمانان و جولەكە و گاور.

14- ئيمامى ( ابن القيم الجوزى ) له "مدارج السالكين"(1/336) ئەفەرمێت:

والصحيح: أن الحكم بغير ما أنزل الله يتناول الكفرين : الأصغر والأكبر بحسب حال الحاكم ، فإنه إن اعتقدوجوب الحكم بما أنزلالله في هذه الواقعة ، وعدل عنه عصياناً، مع اعترافه بأنه مستحقللعقوبة ؛ فهذا كفر أصغر. وإن اعتقد أنه غير واجب، وأنه مُخيّر فيه، مع تيقُنه أنه حكم الله، فهذا كفر أكبر. إن جهله وأخطأه، فهذا مخطئ، له حكم المخطئين.

راست ئەوەيە حوكم كردن بەجگە لەوەى الله دايبەزاندوە دوو جۆر كوفر دەگرێتەوە : بچووك و گەورە بەپێى حاڵى حاكمەكە ، ئەگەر بيروباوەرى وابێت واجبە حوكمى خوا لەم ڕووداوەدا بەلام بەهۆى سەرپێچى لێى

لابدات، دان بنێت بەوەی شایستەی سزایە ، ئەوا کوفری بچووکە، بەلام ئەگەر بیروباوەری وابیت واجب نیە لەسەری و سەرپشکە تیایدا بزانێ ئەوە حوکمی الله ، ئەوا کوفری گەورەیە بەلام ئەگەر نەزانێ یان هەڵە بکات ئەوا هەڵەیە، حوکمی بەهەڵەداچوانی هەیە.

منیش ئەڵێم : (ابن القیم) باس لەو حاکمە دەکات وازی لە حوکمی الله هێناوە لە رووداوێکی دیاریکراودا نەك حوکمی کردبێ بەغەیری شەریعەتی الله، وە باس لەو حاکمە ناکات کە حوکمی خوای گۆڕیبێ وەك کاری جولەکەکان و دەسەڵاتدارانی ئەمڕۆی ناوچەکە.

15- هەروەها لە کتێبی "الصلاة وحكم تاركها" لەلاپەرە(72) ئەفەرمیت:

"وهنا أصل آخر، وهو الكفر نوعان: كفر عمل. وكفر جحود وعناد . فكفر الجحود: أن يكفر بما علم أن الرسول جاء به من عند الله جحوداً وعناداً؛ من أسماء الرب، وصفاته، وأفعاله ، وأحكامه. وهذا الكفر يضاد الإيمان من كل وجه . وأما كفر العمل: فينقسم إلى ما يضاد الإيمان، وإلى ما لا يضاده : فالسجود للصنم ، والاستهانة بالمصحف ، وقتل النبيِّ ، وسبه؛ يضاد الإيمان. وأما الحكم بغير ما أنزل الله ، وترك الصلاة ؛ فهو من الكفر العملي قطعاً".

لێرەدا بنچینەیەکی تر هەیە ئەوەش ئەوەیە کوفر دوو جۆرە : کوفری کردەوە

و کوفری نکۆلی وتەکەبوری، کوفری نکۆڵی کردن : خۆی بێباوەر بکات بەو دینەی دەیزانی لەلایەن خواوە هاتوە بۆ پێغەمبەر بە نکۆڵی لێ کردنی و ملنەدانی بۆی. بەلام کوفری کردەوە : دەکرێ بەدوو بەشەوە بەشێکیان دژ و پێچەوانەی ئیمانە ، بەشێکی تریان دژی ئیمان نیە ، کڕنۆش بردن بۆ بت ، یان سوکایەتی کردن بە قورئان ، کوشتنی پێغەمبەر یان جنێو پێدانی ئەمانە دژی ئیمانن بەلام حوکم کردن بە جگە لەوەی الله دایبەزاندوە یان وازهێنان لە نوێژ ، ئەوا لە کردەوە کوفریەکانە .

منیش ئەڵێم : مەبەست لەوەی ئەفەرمیت ( حوکم کردن بەجگە لەوەی الله دایبەزاندوە) بریتیە لەوەی لە ڕووداوێکدا حوکم نەکات بەو حوکمەی الله دایبەزاندوە ، مەعنای ئەوە نیە حوکم بکات تیایدا بەحوکمێکی تر جگە لە حوکمی الله، وەك ئەوەی بڵێ : سابت بوە فلانە کەس دزە ، ئێمەش بەبەند کردنی بۆ ماوەی مانگێك حوکمی ئەدەین، یان سابت بوە فلانە کەس زیناکارە بەلام مادام بەڕەزامەندی هەردوولا بوە هیچ سزایەکیان لەسەر نیە.

ئەمەش وتەی (ابن القيم ) لەبارەی ئەو کەسەی بەغەیری شەرعی الله حوکم دەکات و ئەفەرمیت:

" وقد جاء القرآن وصح الإجماع بأن دين الإسلام نسخ كل دين قبله ، وأن من التزم ما جاءت به التوراة والإنجيل ، ولم يتبع القرآن فهو كافر " (أحكام أهل الذمة :1/ 259).

واتە: قورئان هاتوە لەگەل کۆدەنگی ڕاست و دروست کەوا دینی ئیسلام

هەموو دینەکانی پێش خۆی سڕیوەتەوە و هەرکەسێك دەستگرتوو بێت بەوەی لە تەورات و ئینجیل دا هاتوە و شوێنی قورئان نەکەوێت ئەوا کافره.(أحكام أهل الذمة : 259/1).

16- ئیمامی (ابن كثير) لە " تفسير القران العظيم" (61/2) ئەفەرمێت:

﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللّهُ فَأُوْلَـئِكَهُمُ الْكَافِرُونَ﴾ لأنهم جحدوا حكم الله قصداً منهم وعناداً وعمداً، وقال ههنا: (فَأُوْلَـئِكَ هُم الظَّالِمُونَ) لأنهم لم ينصفوا المظلوم من الظالم في الأمر الذي أمر الله بالعدل والتسوية بين الجميع فيه، فخالفوا وظلموا وتعدوا".

واته :

(ومن لم يحكم بما أنزل الله فأولئك هم الكافرون) لەبەرئەوەی بەمەبەست و ملنەدان وئەنقەست نکۆڵیان کرد لە حوکمی الله، وە خوای گەورە لە ئایەتەکەی تردا ئەفەرمێت : ( فأولئك هم الظالمون ) لەبەرئەوەی تۆڵەیان بۆ ستەم لێکراو نەدەکردەوە لە ستەمکارکە خوای گەورە فەرمانی کردبوو بەدادپەروەری و یەکسانی لەنێوان هەموان، پێچەوانە و ستەم ودەستدرێژیان کرد.

منیش ئەڵێم : ئیمامی ئیبن و کەسیر لیرەدا باس لەو کەسە دەکات کە حوکم بەو حوکمە ناکات الله دایبەزاندوە بە نکۆڵیٚ و ملنەدان و ئەنقەست.

ئەمەش کوفرەکەی کوفری گەورەیە دەرهێنەرە لە دین.

ئەمەش وتەی (ابن کثیر) لەبارەی ئەو حاکمەی بە غەیری شەرعی الله حوکم دەکات :

وإليك كلام ابن كثير في الحاكم الذي يحكم بغير شرع الله :
يقول ابن كثيرـ رحمه الله ـ في تفسير قوله تعالى ] أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنْ اللَّهِ حُكْمًا لِقَوْمٍ يُوقِنُونَ [( المائدة 50 )
" ينكر تعالى على من خرج عن حكم الله المشتمل على كل خير الناهي عن كل شر وعَدَلَ إلى ما سواه من الآراء والأهواء والاصطلاحات التي وضعها الرجال بلا مستند من شريعة الله ، كما كان أهل الجاهلية يحكمون به من الضلالات والجهالات مما يضعونها بآرائهم وأهوائهم ، وكما يحكم به التتار من السياسات الملكية المأخوذة عن ملكهم جنكز خان الذي وضع لهم الياسق ، وهو عبارة عن كتاب مجموع من أحكام قد اقتبسها عن شرائع شتى من اليهودية والنصرانية والملة الإسلامية وغيرها، وفيها كثير من الأحكام أخذها من مجرد نظره وهواه ، فصارت في بنيه شرعا متبعا يقدمونها على الحكم بكتاب الله وسنة رسوله صلى الله عليه وسلم ، فمن فعل ذلك فهو كافر يجب قتاله حتى يرجع إلى حكم الله ورسوله فلا يحكم سـواه في قليـل ولا كثـير. ( تفسير ابن كثير: 2/67.)

واتە : ئیمامی "ئیبن کەثیر" (رحمە ): لە تەفسیری ئایەتی: "أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللَّهِ حُكْمًا لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ" دەفەرمووێ: (خوای گەورە سەرزەنشتی ئەوانە دەکا کە لە حوکمی خوا دەردەچن و لا دەدەن، کە

هەموو خێرێکی لەخۆگرتووە و قەدەغەی هەموو خراپەیەک دەکا و ئەو کەسەی لا دەدات بۆ لای غەیری ئەو لەو بۆچوون و هەوا و ئارەزوو و دەستوورانەی کە مرۆڤەکان دایان ناوە بەبێ وەرگرتن لە شەریعەتی خوا، هەروەکو خەڵکی جاهیلیەت لەو گومڕاییانەی حوکمیان پێی دەکرد بە هەوا و ئارەزوو و بۆچوونەکانیان و هەروەکو ئەوەی تەتار حوکمیان پێ دەکرد لە سیاسەتە پادشاییە وەرگیراوەکەیان لە پادشاکەیان "جەنگیز خان" کە "یاسق"ی بۆ دانان کە ئەویش بریتیبوو لە کتێبێکی کۆکراوە لە حوکمەکان کە وەری گرتبوو لە شەریعەتی جیاجیا، لە یەهوودیەت و نەصڕانیەت و ئیسلام و غەیری ئەوانە، وە تێیدا چەندین حوکم هەیە کە لە هەوا و ئارەزوو و بۆچوونی خۆی وەری گرتووە، جا ئەو یاسقە لەناو کوڕەکانی بووە شەرعێکی پەیڕەوکراو کە بەپێش حوکمکردن بە کتێبی خوا و سوننەتی پێغەمبەرەکەیان دەخست، جا ئەوەی لەوان ئەو کارە بکات؛ ئەوا کافرە و واجبە جەنگی لەگەڵ بکرێ هەتاکو دەگەڕێتەوە بۆ حوکمی خوا و پێغەمبەرەکەی، لە غەیری حوکمی خوا و پێغەمبەرەکەی نابێ هیچ حوکمێک پەیڕەو بکرێ لە کەم و زۆر)

وە ئیمام( ابن كثير ) ئەفەرمێت :

(ئەوەی واز بێنێت لە شەرعی موحکەم کە دابەزیوەتە سەر موحەممەدی کوڕی عبد  کۆتای پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) و حوکم بباتە بەر

شەریعەتە مەنسوخەکانی تر ئەوا کافربووە! چ جای ئەو کەسەی حوکم دەباتە بەر (یاسا) و بەپێش شەرعی خوای گەورەی دەخات! ئەوەی ئەو کارە بکات بە کۆدەنگی موسوڵمانان کافر بووە )

17- ئیمامی (الشاطبی) لە "الموافقات"(39/4) ئەفەرمیت:

"هذه الآية والآيتان بعدها نزلت في الكفار ، ومن غيّر حكم الله من اليهود ، وليس في أهل الإسلام منها شيء؛ لأن المسلم –وإنارتكب كبيرة- لا يقال له: كافر".

واتە: ئەم ئایەتە و دوو ئایەتی پاش ئەمەش لەبارەی کافرانەوە دابەزیوە هەرکەسێك حوکمی خوا بگۆڕێ لە جولەکە ، هیچی دەربارەی ئەهلی ئیسلام نیە ، چونکە موسڵمان گەرچی تاوانێکیش ئەنجام بدات پێی ناوترێ کافر.

منیش ئەڵێم: ئیمامی شاطبی لێرەدا ئایەتەکانی ( 44 و 45 و 47) سورەتی مائیدە روون دەکاتەوە بۆ کێ دابەزیون کە ئەو جولەکانەن حوکمی خوایان گۆڕیوە، وە هەرکەسێك هەمان کاری ئەوان بکاتەوە کافرە وەکو ئەوان، چونکە ئەو کارەی ئەوان یەکێك نیە لە تاوانە گەورەکان بەلکو کوفرە و لەدین دەرت دەکات، موسڵمانان کاری وایان لێ ناوەشێتەوە چونکە ئەگەر هەمان کاری ئەوان بکەن و حوکمی الله بگۆڕن بە موسڵمان هەژمارناکرێن، دەکرێ موسڵمان تاوانێ گەورە ئەنجام بدات و لە

رووداوێك دا حوكم به حوكمی خوا نه‌كات به‌بێ ئه‌وه‌ی حوكمی خوا بگۆڕێ وێنه‌ی ئه‌مه پێی ناوترێ كافر و ده‌رچوو له‌ دین مادام به حه‌ڵاڵ و ڕه‌وای نه‌زانێت. وه وته‌كه‌ی ئیمامی شاطبی ئه‌وه ناگه‌یه‌نێت كه‌سێك له موسڵمانان هه‌مان كاری جوله‌كه بكاته‌وه كاره‌كه‌ی به‌تاوان هه‌ژماربكرێ و پێی كافر نه‌بێـت تاكو به‌حه‌ڵاڵی نه‌زانێـت.!!!

18- ئیمامی (ابن أبی العز الحنفی) له شه‌رحی "الطحاویة" لاپه‌ره(323) ئه‌فه‌رموێت:

وهنا أمر يجب أن يتفطن له، وهو: أن الحكم بغير ما أنزل الله قد يكون كفراً ينقل عن الملة ، وقد يكون معصية: كبيرة أو صغيرة، ويكون كفراً: إما مجازاً؛ وإما كفراً أصغر ، على القولين المذكورين. وذلك بحسب حال الحاكم: فإنه إن اعتقد أن الحكم بما أنزل الله غير واجب، وأنه مخير فيه، أو استهان به مع تيقنه أنه حكم الله ؛ فهذا أكبر. وإن اعتقد وجوب الحكم بما أنزل الله، وعلمه في هذه الواقعه ،وعدل عنه مع اعترافه بأنه مستحق للعقوبة؛ فهذا عاص، ويسمى كافراً كفراً مجازيا، أو كفراً أصغر. وإن جهل حكم الله فيها مع بذل جهده واستفراغ وسعه في معرفة الحكم وأخطأه؛ فهذا مخطئ، له أجر على اجتهاده، وخطؤه مغفور. "

واته: لێره‌دا كارێك هه‌یه پێویسته زیره‌كانه لێی بڕوانین: ئه‌ویش حوكم كردنه به‌غه‌یری دابه‌زێنراوی خوا، جاری واهه‌یه كوفرێكه ده‌رت ده‌كات له

**دین و جاری واش هەیە سەرپێچیە : وەك تاوانی گەورە یان بچووك وە یان کوفری مەجازیە یان کوفری بچووکە لەسەر هەردوو ئەو ووتەیەی باسکراوە، ئەوەش بەپیی حاڵەتی حاکمەکە، ئەگەر بیروباوەری وابێت واجبە حوکم کردن بە دابەزێنراوی الله ، بشزانێ حوکمی خوا لەو ڕووداوەدا بەڵام لیی لابدا خۆیشی بەشایستەی سزا بزانێ ، ئەمە سەرپیچیکارە ناوی کافری لێ دەنرێ کوفرێکی مەجازی یان کوفری بچووك، بەلام گەر لەو رووداوەدا دا هەوڵدان و بەگەرخستنی هەموو تواناکانی حوکمی خوای نەزانی و هەڵەی کرد ئەوا هەڵەیە ، پاداشتی بۆ هەیە لەسەر ماندووبونەکەی و هەڵەکەشی چاوپۆشی لێ دەکرێ.**

**منیش ئەڵێم: وتەکەی (ابن العز) دەربارەی حاکمی موسڵمانە کە حوکم بەشەرعی الله دەکات بەلام لەرووداوێکی دیاریکراودا حوکمی پێ ناکات ئائەمەیە وردەکاری لەحەقیدا دەکرێ و بەپێی حاڵ و بیروباوەری حوکمی لەسەر دەدرێ ، و شێخ (ابن العز) باس لەو حاکمە ناکات کە حوکم بەغەیری شەرعی الله دەکات چونکە ئەوکەسەی بەغەیری شەرعی الله دەکات تاکە وەصفی شەرعی بۆی ئەوەیە کە طاغوتە و هیچ وردەکاریەکیش نیە لە حوکمی طاغوت.**

19-ئیمامی (ابن حجرالعسقلانی) له "فتح الباري" (13/120) دەفەرمووێت:

"إن الآيات،وإن كان سببها أهل الكتاب، لكن عمومها يتناول غيرهم، لكن لما تقرر من قواعد الشريعة : أن مرتكب المعصية لا يسمى: كافراً ، ولا يسمى – أيضاً – ظالماً؛ لأن الظلم قد فُسر بالشرك، بقيت الصفة الثالثة"؛ يعني الفسق.

واته: ئەم ئایەتانە هەرچەندە هۆکارەکانیان ئەهلی کیتاب بێت، بەڵام گشتاندنەکەی غەیری ئەوانیش دەگرێتەوە ، بەلام کاتێك بریاردراوە لە بچینەکانی شەریعەت : کەسی سەرپێچیکار ناونانرێ بە کافر، وە نانانرێ بە ستەمکار(الظالم) چونکە (الظلم) لێکدراوەتەوە بە " شیرك " سیفەتی سێیەم ماوەتەوە ئەویش "الفسق" ه .

منیش ئەڵێم : (ابن حجر) لیرەدا باس لە گشتی بونی ئایەتەکانی ( 45 و 44 ، 47)سورەتی مائیدە دەکات رونی دەکاتەوە کە هەموو کافران دەگرێتەوە لەوانەی دەرچوون لە ئیسلام ئەوانەی کارەکەی جولەکە ئەنجام دەدەنەوە و هەموو ئەو حاکمانەش دەگرێتەوە کە حوکم ناکەن بە دابەزێنراوی الله، لە ڕووداوێکی دیاریکراو ئەم کارەی بە سەرپێچیەك لە سەرپێچیەکان دادەنرێ مادام بەحەڵاڵی نەزانێت، وە ئیمامی (ابن الحجر) و هیچ زانایەکی ئیسلام نەیان فەرموە هەرکەسێك هەمان کاری جولکە ئەنجام بدات کارەکەی تاوانێك بێت لە تاوانەکان لەدین دەرناچێت تاکو بەحەڵاڵی نەزانێت.

**20- شێخ عبداللطیف بن عبدالرحمن ال  الشیخ له " منهاج التأسیس" لاپەرە ( 71 ) ئەفەرمێت:**

**وإنما يحرُم إذا كان المستند إلى الشريعة باطلة تخالف الكتاب والسنة، كأحكام اليونان والإفرنج والتتر، وقوانينهم التي مصدرها آراؤهم وأهوائهم، وكذلك البادية وعادتهم الجارية... فمن استحل الحكم بهذا في الدماء أو غيرها ؛ فهو كافر، قال تعالى : ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللّهُ فَأُوْلَـئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾ ... وهذه الآية ذكر فيها بعض المفسرين: أن الكفر المراد هنا: كفر دون الكفر الأكبر؛ لأنهم فهموا أنها تتناول<u>منحكم بغير ما أنزل الله، وهو غير مستحل لذلك، لكنهم لا ينازعون فيعمومها للمستحل ،</u> وأن كفره مخرج عن الملة".**

**واتە: ئەوەی یاساغ کراوە بریتیە لەوەی ئەگەر لەسەرچاوەیەکی پوچەڵەوە وەرگیرابێت پێچەوانەبێت بە قورئان وسونەت وەك حوکمەکانی یۆنان و ئیفرەنج و تەتەر و یاساکانیان ئەوانەی لە بۆچوون و هەواو ئارەزوەکانیان سەرچاوەی گرتوە، بەهەمان شێوە خەڵکانی دێهات و دەشت نشینەکان ئەو نەریتانەی لەسەری دەڕۆن، هەرکەسێك حوکم بەمانە حەلال بکات لە خوێن و شتەکانی تر، ئەوە کافرە، خوای تەعالی دەفەرمووێت: ( ومن لم یحکم بما أنزل الله فاولئك هم الکافرون ) هەندێك لە راڤەکارانی قورئان لەبارەی ئەم ئایەتەوە فەرمویانە : ئەو کوفرەی لێرەدا مەبەستە کوفرێکە لە خوار کوفری گەورە، چونکە تێگەیشتون <u>هەرکەسێك دەگرێتەوە کە حوکم دەکات</u>**

**بەغەیری دابەزێنراوی الله کە بەحەڵاڵی نازانێت، بەلام هیچ راجیاو جیاواز نین کە گشتیەکەی بۆ کەسێکە بەحەڵالی دائەنات و کوفرەکەی گەورەیە و لەدین دەرهێنەرە.**

**منیش ئەڵێم: شێخ عبداللطیف مەبەستی لە وشەی بەحەڵاڵ دانان بەحەڵاڵ دانانی دڵ نیە ، بەڵکو بەحەڵاڵ دانانی کردەوەیە، ئەوەش بەوەی رێگە بدات بەو حوکمە، ئەو حاکمەی بەپێچەوانەی قورئان و سونەت حوکم دەکات بەوکارەی حەڵاڵی کردوە هەرکەسێك یاسای پێچەوانەی شەرعی الله دابرێژی لە یاسای فەرەنسی و ئینگلیزی غەیری ئەوان لە یاساکانی مرۆڤ وەبەسەر گەل فەرزی دەکەن و چەندین مەحکەمەی بۆ دادەنەن و ناوی دەنەن بەدادگای دادپەروەری، وە خەڵکیش ناچار دەکەن داوەری کردنیان بۆلای ئەوانە بەرنەوە ، سزای هەرکەسێك یش دەدەن رەخنەی لێ بگرێ ، ئایا ئەمە بە حەڵاڵ کردن وەسف ناکرێ ؟!!**

**21- شێخ عبدالرحمن بن ناصر السعدی لە " تیسیر الکریم الرحمن" ئەفەرموێت:**

**" فالحکم بغیر ما أنزل الله من أعمال أهل الکفر، وقد یکون کفرً ینقل عن الملة،وذلك إذا اعتقد حله وجوازه، وقد یکون کبیرة من کبائر الذنوب، ومن أعمال الکفر قد استحق من فعله العذاب الشدید .. ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا**

أَنزَلَ اللّهُ فَأُوْلَـئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾قال ابن عباس: كفر دون كفر، وظلم دون ظلم،وفسق دون فسق، فهو ظلم أكبر عند استحلاله، وعظيمة كبيرة عند فعله غير مستحل له".

واته: حوكم بەغەیری دابەزێنراوی الله ، لە کرداری ئەهلی کوفرە، جاری واهەیە کوفری دەرهێنەرە لە دین، ئەوەش ئەگەر لەبیروباوەریدا بەحەڵاڵی بزانێ ، وە جاری وا هەیە تاوانێکە لە تاوانە گەورەکان، وە ئەنجامدەرەکەی شایستەیە بۆ سزایەکی بەئێش..( ومن لم يحكم بما أنزل الله فاولئك هم الكافرون) ابن عباس دەفەرمووێت: کوفرە لە خوارکوفر، ستەمە لە خوار ستەم، فوسقە لە خوار فوسق، وە ستەمی گەورەیە لەکاتی بەحەڵاڵدانانی، وە تاوانێ مەزنە لەکاتی ئەنجام دانی و بەحەڵاڵی نەزانی بێ.

منيش ئەڵێم: شێخ عبدالرحمن بن ناصر السعدی لێرەدا باس لەو حاكمە دەكات كە حوكم ناكات بەو حوكمەی الله دايبەزاندوە لە مەسەلەيەكدا و لەرووداوێكی دياريكراودا وە باسی ئەو حاكمە ناكات كە حوكم بەغەيری شەريعەتی الله دەكات، هەربۆيە شايەدی و بەڵگەی بە وتەكەی ابن عباس هێناياوە چونكە ئەو هاوەڵە بەڕێزە رەزای خوای گەورەی لێ بێت ئەو وتەيەی دەربارەی خەوارِيجەكان فەرموو رووی لەوان كردبوو.

22- شێخ محمد الأمين الشنقيطی لە " أضواء البيان"(2/104) دەفەرمووێت:

" واعلم: أن تحرير المقال في هذا البحث: أن الكفر والظلم والفسق، كل واحد منها أطلق في الشرع مراداً به المعصية تارة، والكفر المخرج من الملة أخرى: ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللّهُ﴾ معارضاً للرسل، وإبطالاً لأحكام الله ؛ فظلمه وفسقه وكفره كلها مخرج من الملة. ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللّهُ﴾ معتقداً أنه مرتكب حراماً، فاعلقبيحاً،فكفره وظلمه وفسقه غير مخرج منالملة"

واتە: بزانە وتەی راست لەم توێژینەوەیەدا ئەوەیە هەرکاتێك وشەی (الكفر) یان ( الظلم ) یان (الفسق )لەشەرعدا هات هەندێك جار مەبەست پێی تاوانە و هەندێ جاریش مەبەست پێی کوفری گەورە و دەرچونە لە دین، هەرکەسێك حوکم نەکات بەوەی الله دایبەزاندوە بۆ بەرهەلستی کردنی پێغەمبەران یان بۆ پوچەڵکردنەوەی حوکمەکانی الله ، ئەوا ستەم و فوسق و کوفرەکەی گەورەیە و لەدین دەری دەکات، بەڵام ئەو کەسەی ( هەرکەسێك حوکم نەکات بەوحوکمەی الله دایبەزاندوە )بیروباوەری وابێ حەرام و کارێکی ناشرینی ئەنجام داوە ئەوا ستەم و فوسق و کوفرەکەی گەورە نیە و دەری ناهێنێ لە دین.

منیش ئەڵێم : ئەم ووتیە زۆر روونە هەر ئەوەیە کە من ئەیڵێم و چونکە وتەکەی شێخی شەنقیطی رونە دەربارەی ئەو حاکمەی حوکم ناکات بە دابەزێنراوەی الله لە ڕووداوێکی دیاریکراودا لەگەل ئەو حاکمەی لە ڕووداوێکی دیاریکراودا حوکم بەغەیری شەرعی الله تعالی دەکات، ئایا

هەرکەسێك حوکم بکات بەغەیری شەرعی الله هەر لە مەسەلەیەکدا بێت ئایا پیچەوانە و بەرهەڵستی پێغەمبەرانی نەکردوە ؟ ئایا حوکمی خوای پوچەڵ نەکردۆتەوە ؟!! بۆیە هەرکەسێك وتەکانی شێخی شەنقیطی بخوێنێیتەوە لە ( أضواء البيان ) دەربارەی یاسا دەستکردەکان بۆی دەردەکەوێ بەهیچ شێوەیەك ئەو شێخە بەرێزە دوو دڵ نەبوە لە کافرکردنی ئەو کەسانەی حوکم بەو یاسایانە دەکەن وە زۆر بەئاشکرا بەدەرچوو لە دینی لە قەڵەم داون.

## (( لەکۆتاییدا ))

**<u>هەڵوێستەیەکی تری زانایان هەیە لەبارەی باسەکەمانەوە پێم خۆشە بۆتان نەقڵ بکەم و سوودمەند بن لێی ئەویش ئەوەیە</u>**

**تۆمەتی خەواریج بە هێزترین بەڵگەیە ـ بە گومانی خۆیان ـ بە دەست ئەو کەسانەی حاکمە تاغووتەکان کافر ناکەن، چونکە ئەوان بانگەشەی ئەوە دەکەن کافرکردنی ئەو کەسەی حوکم بە قوڕئان ناکات، قسەو فیکری خەواریجە!!!**

**دەڵێن:ئەوەتا خەواریجەکانیش ئەو ئایەتانە بە بەڵگە دەهێننەوە کە ئێوە دەیهێننەوە،(ومَن لم يحكم بما أنزل الله فأولئك هُم الكافرون).وە(إن الحكم إلا لله).**

بۆیە پێویستە بزانین مەبەستی خەواریجەکان چی بوو بەم ئایەتانە و، چۆن لێی تێگەیشتبوون و،لەسەر کێیان جێبەجێ دەکرد.
لەسەرەتادا دەڵێم:یەکێك لە نیشانەی مەدخەلیە مورتەدە مورجیئەکان، تۆمەتبارکردنی بانگخوازانی تەوحیدە بە خەواریج وتەکفیری بە بێ بەڵگە، وە بەبێ ئەوەی شارەزاییان هەبێ بە ڕێبازی خەواریج و لێی تێگەیشتبن، وە ئەم تۆمەتەش هەر لە کۆنەوە چەکی دەستی غولاتی موڕجیئەکان بووە و، ئەهلی سوننەیان پێ ترساندووە.(كبرت كلمة تخرج من أفواههم إن يقولون إلا كذبا).

وخصومنا قد (جرمونا) بالذي
هو غاية التوحيد والإيمانِ!

سلّوا على سنن الرسول وحزبه
سيفين سيف يد وسيف لسانِ

لەو زانایانەی ئەم تۆمەتەیان بۆ هەڵبەستراوە:

-ئیمامی ئەهلی سوننە ئەحمەدی کوڕی حەنبەل(ڕەحمەتی خوای لێبی)، کاتێك دەیوت قوڕئان کەلامی خوایە و، ئەوەشی بڵێ دروستکراوە ئەوە کافرە، کەسانێك ڕەخنەیان لەو قسەیە گرت و، گوتیان ئەوە قسەی خەواریجە،واتە کافرکردنی ئەو کەسەی بڵێ قوڕئان دروستکراوە، کە ئیمامی ئەحمەد ئەو قسەیەی بیست پێکەنی و، گوتی:ئەوانە خەڵکانێکی

خراپن!!!

-شەیخولئیسلام ئیبن و تەیمییە(ڕەحمەتی خوای لێبی)، هەر لە سەردەمی خۆیەوە هەتا ئێستاش خەڵکانێك هەبووینە و هەنە کە تۆمەتی خەواریجی دەدەنە پاڵ.

-شەیخولئسیلام موحەممەدی کوڕی عبدالوهاب(ڕەحمەتی خوای لێبی)، ئەم زانا بەڕێزە بە هۆی بانگەوازی بۆ تەوحید و کافرکردنی موشریکەکان، زۆر جار تۆمەتی خەواریجی دراوەتە پاڵ.

شیخ أبو بطین دەفەرمووێ:زۆرێك لەخەڵکی ئەم سەردەمە وا گومان دەبەن کە موحەممەدی کوڕی عبدالوهاب وشوێنکەوتووەکانی خەواریجن،...، وەکەسێکیش ئەو قسەیە دەکات کە یاخی و کەللە ڕەق بێت، مەبەستی ئەوەیە خەڵکی عەوام دوورخاتەوە، یاخود کەسێك ئەم قسەیە دەڵێت کە نەزان بێت بە ڕێبازی خەواریج و، لەبەر نەزانینی ئەو قسەیە دەکات.(مجموعة الرسائل٥٢/١٧).

ئیتر بەم شێوەیە تا ئەمڕۆش ئەهلی سوننە ئەم تۆمەتەیان دەدرێتە پاڵ، کە ئەوان لێی دوورن.

وە ئەگەر بێتوو مورجیئەکان تاخیر سەریان هەڵنەدابا، لەوانەیە ئیمامی ئەبوبەکر و ئەو صەحابانەیان بە خەواریج لە قەڵەم دابا، کە عەڕەبە هەڵگەڕاوەکانیان بە کافر دەزانی!!!

ئێستا با بێین باسی مەبەستی خەواریجەکان بکەین لەسەر ئەم دوو ئایەتە:

**-(ومن لم يحكُم بما أنزل الله فأولئك هُم الكافرون).**

**جارێ ئەوەی لە عەقیدەی خەواریجەکان شارەزا بێ دەزانێ یەکێك لە بنچینەکانی ڕێبازی خەواریج ئەوەیە،کە بە گوناهی گەورە خەڵك کافر دەکەن.**

**ئینجا کێشەی خەواریجەکان لێرەدا ئەوەبوو کە جیاوازییان نەدەکرد لە نێوانی چەمك و زاراوە(الحكم)وە(العمل)یا(التطبيق)، بۆیە هەموو گوناە و تاوان و سەرپێچییەك لەلای ئەوان حوکم کردن بوو بە غەیری قوڕئان، وە هەرکەسێکیش حوکم بکات بە غەیری قوڕئان لەلای ئەوان کافرە بەبێ تەفصیل.**

**هەروەکو ئیمامی فەخری ڕازی لە تەفسیرەکەیدا دەفەرمووێ:(أما الخوارج فقد احتجوا بهذه الآية، وقالو: إنما نص في أن كل من حكم بغير ما أنزل الله فهو كافر، وكل من أذنب فقد حكم بغير ما أنزل الله، فوجب أن يكون كافرا).(تفسير الرازی١٢/٥).واتە:خەواریجەکان ئەم ئایەتەیان دەکردە بەڵگەو، دەیانگوت:ئەم ئایەتە دەقێکە دەربارەی هەرکەسێك کە حوکم بکات بە غەیری قوڕئان ئەوە کافرە، وەهەرکەسێکیش گوناە و تاوان ئەنجام بدات ئەوە حوکمی کردووە بە غەیری قوڕئان، بۆیە دەبێ ئەو کەسە کافر بێت.**

**بەڵام ئەم بۆچوونە هەڵەیەی خەواریجەکان لە دوو ڕووەوە وەڵام دەدرێتەوە:**

**یەکەم: ئەم ئایەتە تایبەتە بەو حاکم و کەسانەی کە حوکم دەکەن لە نێوان**

**خەڵکی و کێشەی خەڵکی چارەسەر دەکەن، وەکو سوڵتان و قازی وجگە لەمانەش،نەك مەبەستی خودی کردەوەکانی مرۆڤ بێت، چونکە ئەوکەسەی تاوانێك ئەنجام بدات، ئەوە پێی دەوترێ(لم یعمل بالقرآن)نەك(لم یحکم بالقرآن).**

**وە خوای گەورەش فەرموویەتی:(ومن لم یحکم بما أنزل الله)نەیفەرمووە:(ومن لم یعمل بما أنزل الله)!!!**

**بۆیە ئەگەر هەرکەسێك گوناه و تاوانێکی ئەنجام دا پێی بوترێ ئەوە حوکمی کردووە بە غەیری قورئان، بەڕاستی ئەوە گۆڕینی واتای ئایەتەکەیە، دواجاریش ئەمە سیفەتی خەواریجەکانە لە کۆن و لە نوێدا.**

**ئا لێرەوەیە کە پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)باسی خەواریجەکان دەکات و دەفەرمووێت:(یقرؤن القرآن لایجاور حناجرهم).رواه البخاري.واتە:قورئان دەخوێننەوە بەڵام لەگەروویان تێناپەڕێ و ناگاتە دڵیان-کە شوێنی تێگەیشتنە-واتە: لێی تێناگەن.**

**ئێمە گوتمان ئەم ئایەتە تایبەتە بە چارەسەرکردنی کێشەی خەڵك و حوکم کردن لە نێوانیان، نەك گشتی بێت بۆ هەموو کاروکردەوی خودی مرۆڤەکە لە نەفسی خۆیدا، چونکە خوای گەورە پێش ئەو ئایەتە (ومن لم یحکم بما أنزَل الله فأولئك هم الکافرون).المائدة:٤٤.دەفەرمووێ:(وإن حَکمت فاحْکم بینهم بالقِسط).المائدة:٤٢.**

**وە هەروەها لە چەندان شوێنی تریش لە قورئاندا باسی ئەوە کراوە کە حوکمت کرد لە نێوان خەڵکی، نافەرمووێ کە حوکمت کرد لەسەر خودی**

خۆت!!!وەکو:(خصْمان بَغا بعضنا على بَعض فاحكم بينَنا بالحق).ص:٢٢.

(يا داود إنا جعلناك خليفة في الأرض فاحكم بين الناس باحق).ص:٢٦.

(وإذا حَكمتم بين الناس أن تحكموا بالعدل).النساء:٥٨.

(فاحْكم بينهم بما أنزل الله).المائدة:٤٨.

(لتحم بين الناس بما أراكَ الله).النساء:١٠٥.

(يحكموك فيما شَجر بينهم).النساء:٦٥.

کەواتە خۆشەویستان بۆمان ڕوون بۆوە کە ئەم ئایەتە تایبەتە بەو کەسەی حوکم لە نێوانی خەڵکی دەکات، جا قازی و حاکم بێت یا هەرکەسێکی تر کە حوکم لە نێوانی خەڵکی بکات .

دووەم: هەتا ئەگەر وامان دانا بۆچوونی خەواریجەکان ڕاستبێ کە دەڵێن: (ئایەتەکە گشتیە دەربارەی هەرکەسێك کە گوناه و تاوانێکی کرد، حوکمی کردووە بە غەیری قوڕئان)، ئەوە جیاوازی نییە لە نێوان موسڵمانان کە چەندان ئایەت و فەرموودەی تر هەیە دەربارەی هەندێ تاوانبار کە کافر نابن ، وەکو:زیناکەر و دز و ئارەق خۆر و....هتد.

دوای ئەم باسە سەرنجی خوێنەران بۆ خاڵێکی گرنگ ڕادەکێشم ئەویش ئەوەیە بابزانین ئایە لەو بابەتەدا، وە بەهەڵە تێگەیشتن لەو ئایەتە ئێمە خەواریجین یا "عدواللطیف"ی مەدخەلی موڕتەد و دەروێشەکانی؟؟؟

دەروێشێکی عدواللطیف کە ناوی(د.کاوە سەنگاوی)ە کیتابێکی نووسیوە بەناوی(چارەسەر بۆ گەڕانەوەی حوکمی خواو سەرکەوتنی موسڵمانان لە

نێوان سەرگەردانی ئەهلی بیدەع و کارلەجێی ئەهلی سوننەدا).

عدواللطیف پێداچوونەوەی بۆ کردووە پێشەکیەکیشی بۆ نووسیوە جا لە پێشەکیەکەیدا لە لا-١٣-دا ڕوودەکاتە حیزبە بەناو ئیسلامییە موڕتەدەکان و دەڵێت:(کوا حاکمیەتی خوا لەجل و بەرگ و ئاکارتان، کوا ڕیشتان، کوا بۆچی شەڕواڵەکانتان لە زەوی دەخشێت؟؟!!بۆچی ژن و پیاوتان تێکەڵ دەکەن، ئافرەتی جوان و ڕازاوە دەخەنە سەرشاشەکانتان بگرە هەندێ جار بەسەر و سنگی ڕوتیش!!
ئایا ئەمەیە حاکمیەتی خوا، یا گۆرانی ومۆسیقایەکەتان حوکمی خوایە؟؟).

وە لە لاپەڕە-١٦-شدا دەڵێت:(بەڕاستی سەیرە زۆر لە ئیسلامیەکان خۆیان حوکمی خوا لە خۆیاندا جێبەجێ ناکەن کەچی داوا لە عەلمانیەکان دەکەن بەتەواوی حاکمیەتی خوا جێبەجێ بکەن!!).
خۆشەویستان بەوردی ئەم قسانەی دکتۆر بخوێننەوە، بۆ ئەوەی عەقیدەی ئەم "دکتۆرە نەخۆشە" بناسن!
توخوا ! نا دکتۆر ئەمە چۆن لەدین حاڵیبوونێکە، ئەمە عەقیدەی ئەهلی سوننەیە، یا عەقیدەی خەواریجە!
ئەگەر کەسێك شەڕواڵی کورت نەبێ، ئەگەر درێژیشی بکات ئەوە تۆ بۆت نییە پێی بڵێی حاکمیەتی خوای جێبەجێ نەکردووە و، حوکمی بە قوڕئان نەکردووە، چونکە حوکم نەکردن بە قوڕئان-بە عەمدی-یا کوفری گەورەیە، یا کوفری بچووکە، وە کوفری بچووکیش تاوانەکەی لە گوناهی

گەورە گەورەترە، جا ئایە ڕیش تاشین و شەڕواڵ درێژکردن و ژن و پیاو تێکەڵکردن و گۆرانی و مۆسیقا، تاوانن یا کوفرن؟؟؟

بۆیە ڕووی پرسیارم لە نا دکتۆر دەکەم و دەڵێم: دکتۆر ئەگەر کەسێك تاوانێکی کرد، ئایا حوکمی بە قوڕئان نەکردووە –وەکو خەواریجەکان دەڵێن–یاخود کاری بە ئایەتێك یا حەدیسێك نەکردووە–وەکو ئەهلی سوننە دەڵێن؟؟؟

بۆیە کاکی دکتۆر گەر تۆ ئەو جۆرە قسانە بکەی، ئەوە سەیرە نییە کە زۆر جار دەروێشەکانتان دەڵێن:ئەوەی نەزەر بکات ئەوە حوکمی بە قوڕئان نەکردووە!!!

ئەم قسانەشیان هەمووی بۆ ئەوەیە کە کەسی بەرامبەر بترسێنن(ئیرهابی فیکری)بۆ ئەوەی نەڵێ ئەم حاکمە تاغووتانەی حوکم بە یاسا دەستکردەکان دەکەن کافرن، چونکە تۆش ئەگەر نەزەر بکەی ئەوە حوکمت نەکردووە بە قوڕئان و......!!!

ئێستا دەڵێم: دوای ئەم ڕوونکردنەوەیە ئاشکرابوو کە کێ عەقیدەی خەواریجی هەیە ئێمە یان ئێوە؟

بەڕاستی(رمتني بداء وانسلت)واتە:تۆمەتبارت کردم بە سیفەتێك،بە شتێك کە لەخۆت دایە و بۆ خۆت دەگەڕێتەوە.

دیارە دکتۆر تۆ تا ئێستا جیاوازی ناکەی لە نێوانی حوکم نەکردن بە قوڕئان(عدم تحكيم الشريعة)، کە تایبەتە بەو کەسەی حوکم دەکات لە

نێوانی دووکەس و زیاتر، جا ئەو کەسە حاکم بێت یان نا، وە لە نێوانی جێبەجێ نەکردنی فەرمانی خوا و پێغەمبەر(عدم تطبيق أوامر الله ورسوله)، کە کەسێك لە خودی خۆیدا جێبەجێی ناکات.

من كان هذا القدر مبلغ علمه

فليستتر بالصمت والكتمانِ

وەهەروەها خەواریجەکان تێگەیشتنێکی هەڵەی تریشیان هەبوو دەربارەی ئەو ئایەتە،ئەویش ئەوەبوو:ئەو ئایەتەیان دەکردە بەڵگە لە سەر ئەو حاکمانەی کە موسڵمان بوون و بە ئیسلام ڕازی بوون،وە حوکمیشیان بە قورئان دەکرد،بەڵام هەندێ هەڵە و لادان و،یا جاروبار حوکمی خوایان جێبەجێ نەدەکرد،لەبەر هەواو و ئارەزوو، یا ڕەشوە،یا خزمایەتی،نەك لەبەرئەوەی باوەڕیان پێنەبووبێت،یا پێیان وابووبێ کە ئەم حوکمە بە کەڵك نایێت،وەهەروەها یاسەیەکی نوێشیان دانەنابوو لە جیاتی حوکمەکەی خوا کاری پێ بکەن.لێرەدا خەواریجەکان دەهاتن ئەو جۆرە حاکمەیان کافردەکرد،ئەو ئایەتەشیان دەکردە بەڵگە،کە بێگومان حاکمی ئاوا کارەکەی کوفری بچووکە و لە بازنەی ئیسلام ناچێتە دەرەوە،بە بەڵگەی ئەوەی جارێك خەواریجەکان هاتنەلای (أبوملجز)ـ یەکێکە لە زانایانی سەلەف ـ گوتیان:ئەدی خوا نافەرمووێ:(ومن لم يحكم بما أنزل الله فأولئك هم الكافرون)،(...هم الظالمون)،(...هم الفاسقون) ئەویش فەرمووی:بەڵی،قورئان دینیتیان کە حوکمی پێدەکەن،وە بانگەوازی بۆ دەکەن،بەڵام ئەگەر شتێکیشیان واز لێهێنابێ دەزانن ستەمیانکردووە. (عمدة

التفسير،أحمد شاكر).

-(إن الحكم إلا لله).خەواریجەکان کاتێك دروشمی(لاحكم إلا لله)یان بەرزکردبۆوە و، دەیانگوت:(إن الحكم إلا لله)، کە ئیمامی عەلی و معاویە ڕێککەوتن لەسەر ئەوەی ئەبو موسای ئەشعەری و عەمڕی کوڕی عاص ببنە حەکەم لە نێوانیان، ئا لەو کاتەدا خەواریجەکان ڕەخنەیان گرت و ڕازی نەبوون بەم کارە و گوتیان:(لاحكم إلا لله).

جا با بزانین مەبەستی خەواریجەکان چی بوو کە دەیانگوت(لاحكم إلا لله).

کێشەی خەواریجەکان ئەوەبوو وایان دەزانی ئەو ئایەتە:(إن الحكم إلا لله)وا دەخوازی کە نابێ هیچ کەسێك بکرێتە حاکم لە نێوانی خەڵکی، چونکە حوکم هەر هەموو بۆ خوایە.

بۆیەش کاتێك ڕوداوی تەحکیم هاتە پێشەوە، خەواریجەکان گوتیان:ئیمامی عەلی پیاوی کردۆتە حەکەم(حكم الرجال)و، حوکمیش هەموو بۆ خوایە نەك بۆ پیاوان!!

ئیتر ئەوە بوو ئیمامی عەلیش وەڵامی دانەوە و هات قوڕئانێکی گەورەی لە پێش خۆی داناو فەرمووی:ئەی قوڕئانەکە قسە لەگەڵ خەڵك بکە، مەبەستی وەڵامدانەوەی خەواریجەکان بوو، تێیگەیاندن کە قوڕئان قسە ناکات، بەڵکو دەبێ پیاوان بێن دەستی بدەنێ و حوکمی پێبکەن.

کەواتە ئیمامی عەلی حەق بوو، چونکە دانانی کەسێك بۆ ئەوەی حوکم لە

**نێوان خەڵکیدا بکات بە گوێرەی شەڕعی خوا و، چاکسازی لە نێوانی خەڵکی بکات،ئەوە خودی حوکمی خوایە، نەك حوكم كردن بێت بە غەیری قوڕئان.**

**کەواتە کێشەی ئیمامی عەلی لەگەڵ خەواریجەکان لەسەر ئەوە نەبوو کە ئەو کەسەی حوکم بکات بە غەیری قوڕئان کافرە یان نا، بەڵکو کێشەکە لەوەدابوو ئایە دانانی حەکەم لە نێوانی دوو کۆمەڵی موسڵمانان حوکم کردنە بە غەیری قوڕئان یان نا؟**

**یاخود بە شێوەیەکی تر ڕاستکردنەوەی هەڵەی خەواریجەکان بەو شێوە دەبێت بڵێین:(إن الحکم إلا لله)واتە:هەر خوای گەورەیە کە یاسا و دەستور دادەنێ و بڕیار دەردەکات(یعنی الله سبحانه وتعالی حاکم مشرع).بەڵام خۆ هەر خوای گەورەش نایێ لە نێوان خەڵکی حوکم بکات، بەڵکو واجبی کردووە لەسەر خەڵکی حوکمی پێبکەن و جێبەجێی بکەن، ئینجا ئەو کەسەی حوکمی پێ دەکات هەر پێی دەوترێ حاکم، بەڵام حاکم بە مانای جێبەجێکەر نەك بە مانای یاسا دانەر.(یعنی حاکم منفذ لامشرع).**

**کەواتە:(إن الحکم إلا لله)حوکمی یاسا دانان(تشریع)ە،نەك حوکمی جێبەجێکردن(تنفیذ).**

**بۆیە کاتێکیش ئیبن عەباس چووە لای خەواریجەکان و، لێی پرسین بۆچی دەرچووینە لە دژی ئیمامی عەلی، ئەوانیش چەند هۆکارێکیان باسکرد یەکێك لەو هۆکارانە گوتیان:ئیمامی عەلی پیاوی کردۆتە حەکەم و خوای گەورەش دەفەرمووێ:(إن الحکم إلا لله).ئیبن عەباس وەڵامی دانەوە و**

فەرمووی:دەربارەی ئەو قسەیەتان کە دەڵێن پیاوی کردۆتە حەکەم، ئەوە خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرمووێ:(يأيها الذين آمنوا لاتَقتلوا الصَيد وأنتم حُرم ومن قتله مِنكم متعمدا فَجزاء مثل ما قَتل من النَعم يحكم به ذوا عَدل منكم).وە هەروەها دەربارەی کێشەی نێوان ژن و مێرد دەفەرمووێ:(وإن خِفتم شقاق بَينهما فابْعثوا حكما مِن أهله وحكما من أهْلها). ئینجا فەرمووی ئایا حاکم دابندرێ بۆ ئەوەی خوێنی موسڵمانان پارێزراو بێ ئەوە باشترە،یا دەربارەی خوێنی کەروێشکێك و، کێشەی ئافرەتێك، ئەوانیش گوتیان بەڵێ ئەوە باشترە کە حاکم دابندرێ بۆ پاراستنی خوێن.

کێشەی خەواریجەکان و تێنەگەیشتنیان لە ئایەتەکە، وەکو کەسێکی نەخۆش وایە بیەوێ چارەسەری خۆی بکات، یەکێك بێت ڕێگری لێبکات و پێی بڵێ ئەم کارەت پێچەوانەی ئەو ئایەتەیە:(وإذا مَرضت فهو يشفين).

ئاخر کەسێك نەخۆش بوو ، بۆی دروستە بچێت لەلای دکتۆر چارەسەری خۆی بکات، بە هەمان شێوەش دوو کەس کە کێشەیان لە نێواندا هەیە، دەبێ بچن بۆلای کەسێك بۆ ئەوەی حوکم لە نێوانیان بکات و کێشەکەیان بۆ چارەسەر بکات.

ئیمامی شاطبی دەفەرمووێ: وكذلك الخوارج اتبعوا قوله تعالى:(إن الحكم إلا لله).يوسف:٤٠.وتركوا مبينه:(يحكم به ذوا عدل منكم)،وقوله:(فابعثوا حكما من أهله وحكما من أهلها).

کەواتە لەو بابەتەشدا ئێمە وەکو خەواریج نینە، خەواریجەکان ئایەتەکە(إن الحكم إلا لله)وا تەفسیر دەکەن کە حوکمی تەشریعی و حوکمی تەنفیزی

هەردووکی هەر بۆ خوایە.

بەڵام ئێمە دەڵێین:یاسادانان(تشریع)یەکێکە لە تایبەتمەندییەکانی خوای گەورە، بەڵام جێبەجێکردنی ئەو یاسایە کاری بەندەکانە و، فەرمانیان پێکراوە کە یاسی خوا جێبەجێ بکەن.

لە کۆتاییدا دەڵیم:سوباس بۆ خوا لەو بابەتەشد دەرکەوت کە ئێمە خەواریج نینە،ئێوەی بە ناو سەلەفییەکان خەواریجن لەسەر بانگخوازان، مورجیئەن لەگەڵ تاغووتان.

إذا جاء موسى وألقى العصا فقد بطل السحر والساحرُ!